# زمانی کوردی و
# خەوشی هەندێ وشە و زاراوەی نوێ

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

- بەشی یەکەم -

بەغدا - ٢٠٠٠

## پێشەکی

ئێمە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ فێربوونی وشەکانی زماندا ، فێری ئەو یاسا و دەستوورانەش دەبین ، کە وشەیان پێ دروست دەکرێ و دادەڕێژرێ . ئەمەش ڕێگەمان بۆ خۆش و ئاسان دەکا ، لەتەك وەرگرتنی لە خۆڕا و میکانیکیی هەزاران وشەدا ، بتوانین بە بیر و هۆش لە زمان وردبینەوە و ، شتی شاراوەی ئاشکرا بکەین و فێری ئەوە ببین ، وەك چەکێکی پێویست بەکاری بێنین ...

زمان هەمیشە لە گەشەکردندایە و بە وشە و زاراوەی نوێ دەوڵەمەندتر دەبێ . ئاشکرایە ، کە بۆ ئەمە بە شێوەیێکی سەرەکی ، ئەو کەرەستەیە بەکاردەهێنرێ ، کە لەو زمانەدا هەیە. لە سەرێکەوە وشەی حازر بە دەست هەن و ، لە سەرێکی دییەوە کەرەستەی یاریدەدەر ، بەتایبەتی پێشگر و پاشگر و ڕەگ و قەدی کردار ... بەم چەشنە ، لەو

وشانەی لە زووەوە لە زماندا هەن ، وشەی نوێ پۆدەنرێ .

هەر کەسێك زمانی کوردی بزانێ ، بێ ئەوەی ئەرکێکی ئەوتۆ بکێشێ ، دەتوانێ چەندین وشەی نوێی وەها ناوبێنێ ، کە لەم سەردەمەی ئێمەدا پەیدا بوون . لەم قۆناغەدا ، کە ژیانی ڕووناکبیری و زانستی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی ...ی میللەتی کورد لە برەودایە و تێکڕای جیهان لە پێشکەوتندایە ، بێگومان زمان پێویستی بە وشەی نوێ دەبێ و ڕۆژ بە ڕۆژ وشەی نوێ پەیدا دەبێ .

بەهرەی بوونی زمان ـ نیشانەی بەختەوەریی مەزنی ئادەمیزادە. خۆش ویستنی زمانی زگماك و باش زانینی و چاك بەکارهێنانی ... ئەرکی سەرشانی مرۆڤە و مایەی کامەرانییەتی . ناسین و زانینی وشە و شارەزایی تێدا پەیداکردنی کارێکی بەرز و پێویستە .

من لەم زنجیرە وتارەدا هەوڵ دەدەم خەوش و نادروستیی هەندێ وشە و زاراوە و دەربڕین بگێڕمەوە و بیانخەمە سەر لەنگەری و بێژنگ و گێژ و تەتەڵەیان بکەم و گورگە و بنژیل و زیوانیان لێبگرم ... داوا و تکام لە هاوزمانانم ئەوەیە ، وا تێنەگەن بمەوێ

کوردی فێری کورد بکەم ، بەڵکو بە کوردی و بە کورتی نیاز و مەبەستم ئەوەیە ، هەر بە گفتی دەمی کورد ، گفتی نامۆ و ناڕەسەن ڕاست بکەمەوە :

* * *

زانكۆ :

سی ساڵێك لەمەوبەر كۆڕی زانیاری كورد زاراوەی (زانكۆ)ی دارشت و بیٚ چەند و چوون پەسەندكرا ... ئەمرۆ نەك تەنیا هەر سیٚ (جامعة)كەی كوردستان بە (زانكۆ) ناونراون ، بەڵكو لەسەر زاری هەموانیش بووەتە وشەییٚكی ئاسایی و پتەو رەگی داكوتاوە و ، كەس گلەیی لەو هەڵە گەورەیە نییە ، كە نەك شوان و گاوانان ، بەڵكو زانایان لە رۆنانی ئەو زاراوەیەدا كردوویانە .

لە زمانی كوردیدا بۆ رۆنانی ناوی لیٚكدراو نزیكەی پازدە رِیٚگەی جیاواز هەیە ، وەك:(ناو+ناو) ؛ (ناو+ناوبەند+ناو)؛ (ناو+ئاوەڵناو) ؛ (ئاوەڵناو+ناو) ؛ (ناو+رەگی كردار) ...

لە نیٚو ئەو رِیٚگایانەدا ، یەككگرتنی (ناو و رەگی كردار زۆر باوە . وەك :

مەی + گیٚڕ (گیٚڕان) - مەیگیٚڕ

كۆڵ + گیٚڕ (گیٚڕان) - كۆڵگیٚڕ

كار + گیٚڕ (گیٚڕان) - كارگیٚڕ

...

دار + تاش (تاشین) - دارتاش

سەر + تاش (تاشین) - سەرتاش

بەرد + تاش (تاشین) - بەردتاش

...

شەکر + شکێن (شکاندن) - شەکرشکێن

سەر + شکێن (شکاندن) - سەرشکێن

سەفرا + شکێن (شکاندن) - سەفراشکێن

....

دەست + بڕ (بڕین) - دەست بڕ

قۆڵ + بڕ (بڕین) - قۆڵبڕ

سەر + بڕ (بڕین) - سەربڕ

... و دەیانی دی .

بەڵام ئەو ڕێگەیەی وشەی (زانکۆ)یان پێ ڕۆناوە ، واتە :

ڕەگی کردار + ناو

زان (زانین) + کۆ - زانکۆ

بە هیچ چەشنێك لە زمانی کوردیدا نییە ، لەبەر ئەوەی وشەی ناوبراو دژ بە یاساکانی ڕۆنانی وشەی لێکدراوی کوردی سازکراوە ، ئەوە دەچێتە خانەی هەڵەی زمانەوانییەوە .

جا کە هیچ یەکێك لەو وشانەی سەرەوە ، واتە : (مەیگێڕ) ؛ (کۆڵگێڕ) ؛ (کارگێڕ)...(دارتاش) ؛

(سـەرتاش) ؛ (بـەردتاش)... (شەکرشـکێن) ؛ (سەرشکێن) ؛ (سەفراشکێن)... (دەستبڕ) ؛ (قۆڵبڕ) ؛ (سەربڕ)... نەشێ بکرێن بە (گێرمەی) ؛ (گێڕکۆڵ) ؛ (گێڕکار)... (تاشدار) ، (تاشسەر) ؛ (تاشبەرد)... (شکێنشەکر ) ؛ (شکێنسەر) ؛ (شکێنسەفرا)... (بڕدەست)؛ (بڕقۆڵ)؛(بڕسەر)..ئەوە ڕاست نییە (زان)ی ڕەگی کرداری (زانین)یش پێش ناوەکە ـ (کۆ) بخرێت و ئەمە دەبێتە تێکدانی دەستووره ڕەسەنە ڕێك و پێکەکانی زمانی کوردی.

بۆ زێدە ڕوونکردنەوە ، بەشێك لەو وشە لێکدراوانەی مۆرفێمی (زان) هاوبەشیی لە ڕۆنانیاندا کردووە ، دەخەمە بەرچاو و ئەوەتە لە سەرجەمیاندا ، کەوتووەتە دواوە :

کار + زان - کارزان

قسە + زان - قسەزان

یاری + زان - یاریزان

کوردی + زان - کوردیزان

ڕێ + زان - ڕێزان

زمان + زان - زمانزان

درۆ + زان - درۆزان

...هتد .

بێگومـان کـورد هـەرگیز نـەیوتووە : (زانکـار ؛ زانقسە؛ زان یـاری ؛ زانـکوردی ؛ زانـڕێ ؛ زانزمـان ؛ زان درۆ ... )...

کەواتـە لـە نێـو ئـەو هـەموو وشـانەدا (زانکـۆ) تاکـە وشەیەکە لە ساز و ئاوازی کوردییەوە دوور بێ ...

تێبینی :

١ـ لـە وشـەکانی (زانـا)؛(زانیـار)؛(زانیـاری)...دا مۆرفێمـی (زان) دەکەوێتـە پێشـەوە ، ئـەویش چونکـە ئـەو وشـانە داڕێـژراون ، نـەك لێکدراوـ واتـە لـە داڕێـژراودا پاشـگر بـە دوا ڕەگـدا دێـت ، بـەڵام لـە لێکدراودا ناو بەدوا ڕەگدا نایەت .

٢ـ وێڕای (نـاو) ، ئاوەڵکردار و ئاوەڵناویش لەگـەڵ (زان)دا دێن. وەك : زۆرزان ، کەمزان...

٣ ـ لە وشەکانی وەك : (کۆڕەو)و (کۆبەرـ پوشـپەڕ، جەنگەی گیادروون)...دا (کۆ) لـە سـەردتاوە هـاتووە و ئەوجا ڕەگی کردارەکان ... ئەمانـەش بۆیـە هەڵەیان تێدا نەکراوە ، چونکە زانا و زمانـەوان دایـان نـەناوە...بـەڵکو زادە و سەلیقەی خۆرسکی میللەت هێناونی‌یە بەرهەم.

* * *

( سەرنج ڕاکێشەر) و ( سەرسوڕمێنەر ) و

( وشـــەدارێـــژەر ) و ( هەڵـرێـژەر ) و

( بـزوێنەر )

پاشگری (ـ ەر ) لـە زمـانی کوردیـدا لەگـەڵ ڕەگـی کرداری تێپەڕدا دێت و دەیکاتە ناوی کارا . بەوێنە :

| چاوگ | ڕەگ | پاشگر | ناوی کارا |
|---|---|---|---|
| خوێندن | خوێن | | خوێنەر |
| نووسین | نووس | | نووسەر |
| ئاخاوتن | ئاخێو | | ئاخێوەر |
| چاندن | چێن | | چێنەر |
| ناردن | نێر | ـەر | نێرەر |
| ... | | | |
| تێکۆشان | تێ ـ کۆش | | تێکۆشەر |
| داهێنان | دا ـ هێن | | داهێنەر |
| دانان | دا ـ نێ | | دانەر (١) |

پاشگری ( ـ ەر ) تەنیا لەگەڵ ڕەگی کرداری تێپەڕدا دێت و ناچێتە سەر ڕەگی کرداری تێنەپەڕ. پاشـگرێکی زۆر چالاکـە و بـە بـــەردەوامی لـە گەشەکردندایـە و بە

١) لەم حاڵەتەدا ، کە دوو بزوێن ـ واتـە (ێ)ی کۆتـایی ڕەگـی کرداری (دان) و (ە)ی سـەرەتای پێشـگری (ـ ەر) بـە یـەك گەیشـتوون ، (ێ)ی کۆتایی ڕەگ تێچووە و (ە)ی سەرەتای پاشگر ماوەتەوە .

تایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا بۆ دانان و ڕۆنانی زاراوەی هەمە جۆر کەڵکی زۆری لێوەرگیراوە .

پێویستە پەنجە بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشین ، وشەی (خوێنەر ، نووسەر ... تێکۆشەر ، دانەر...)، کە بە نموونە هێناومانتەوە لە تێکستی کۆنی کوردیدا نابینرێن و نوێباون و تا ڕادەیێك لە ڕۆنانیاندا لە دەستوور لادراوە. لادانەکەش ئەوەیە ، کە لە وشەی کۆنی کوردیدا پاشگری (ـ ەر) لەگەڵ ڕەگی کرداردا نەهاتووە ، بەڵکو چووەتە سەر ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار . بەوێنە :

کۆچەر : کۆچ + ەر

سەنگەر : سەنگ + ەر

لەنگەر : لەنگ + ەر

چەپەر : چەپ + ەر

... هتد .

دانانی پاشگری (ـ ەر) لەگەڵ ڕەگی کرداردا ، ئەگەرچی ناچێتە نێو قاڵبی دەستووری بنەڕەتیی زمانی کوردییەوە و ئەو چەشنە بەکارهێنانە نوێیەش بە گەشەپێدان و فراوانکردنی سنووری بەکارهێنان و دەوڵەمەندکردنی زمان لە قەڵەم بدرێ ، یاخود بەپێچەوانەوە بە کارێکی نادروست و لادان بژمێررێ ،

هیچ لەو ڕاستی‌یە ناگۆڕێ ، کە دەیان وشە لە نووسین و ئاخاوتندا بە جۆرێك بنجیان داکوتاوە ، بڕیاری دەزگا زانستی‌یەکانیش ناتوانێ کاریان تێ‌بکا .

بێ‌گومان ڕەگی کردار بەتەنیا ناوی کارای لێ پەیدا نابێ . واتە : ((خوێن ، نووس ، ئاخێو ، چێن ، نێر ...)) ، کە ڕەگی ((خوێندِن ، نووسین ، ئاخاوتن ، چاندن ، ناردن ...))ن نابنە ناوی کارا (٢)، بەڵام پاشگری (ـ ەر) کردوونی بە ناوی کارا . کاتێ لە پێش ڕەگی کردارەوە (جگە لە کرداری ((کردن ، بردن ، خستن ، دان ، نان )) پێشگر ، وەك (ب+وێر-بوێر) ؛ (نە+مر-نەمر) ؛ (ڕا+گر- ڕاگر) ، (هەڵ + ڕێژ - هەڵڕێژ)؛ (وەر + گێڕ- وەرگێڕ) ؛(تێ +بڕ- تێ‌بڕ) ؛ یاخود وشەییێك دێ ، وەك (خۆش+نووس-خۆش نووس) ؛ (پیاو+کوژ-پیاوکوژ) ؛ (پەیام+نێر=پەیام نێر) ؛ (دوور+بین-دووربین) ؛ (مەلا+بەزێن=مەلابەزێن) ؛ (خوێن+مژ-خوێن مژ ؛ (سەر+تاش-سەرتاش) ؛ (ئاو+کێش-ئاوکێش) ؛

---

٢) هەندێ لەو کردارانەی بە یاریدەی پاشگری (ـ اندن) تێپەڕکراون ، ڕەگیان ناوی کارا پێك دێنێ . وەك

| تێپەڕ | تێپەڕکراو | ڕەگ و ناوی کارا |
|---|---|---|
| بزووتن | بزواندن | بزوێن |

(کـەللە+تـەزێن+کـەللـەتەزێن)؛ (خـەم+ڕەوێـن=خـەم ڕەوێـن) ؛ (سـەرنج+ڕاکێـش=سـەرنج ڕاکێـش) ؛ (سـەر+سوڕ+هێـن=سەرسوڕهێن) ... لەبـەر ئـەوەی لـە خودی خۆیانـاوی کـاران ، ناشێ پاشگری (ـ ەر)یـان بخرێنە سەر (٢) . بـەداخـەوە زوربەی زۆری نووسەرانی

---

٢) هـەرچی کـرداری (خـواردن)ە ، کـە ڕەگەکـەی (خـۆ)یـە ، دەمـێ وشەیێك لە پێشی‌یەوە دێ لـە شێوەی (خـۆر)دا دەردەکـەوێ ، وەك (زۆرخـۆر ـ کەم خـۆر ، نـان خـۆر ، سوێندخۆر ... ) . ئێمـە وای بـۆ دەچین ، کە هۆی ئەمە کارتێکردنی زمانی فارسی بێ ، چونکە قاڵبی ئەو کردارە لە فارسیدا (خوردن)ە و ڕەگەکەشی (خور)ە ... وێڕای ئەوە ، ئەوەش دێنینـەوە یـاد ، کـە لـە بەشـە دیـالێکتی سلێـمانیدا هـەندێ کردار لە ڕێـژەی داخوازیدا دەنگی (ر) لە کـۆتاییەوە پـەیدا دەبێ ، وەك : (بچۆ ـ بچۆرە ؛ بڕۆ ـ بڕۆرە ؛ ببە ـ ببەرە ؛ بێ ـ بێرە ...)
ماموستا ڕەفیق شوانی وای دانـاوە ، کـە وشـەی (خـوەر) و (نـان خوەر) لە دیالێکتی کرمـانجیی ژووروودا نـاوی کاران و یەکەمیان لـە (خـو)ی ڕەگ و پاشـگری (ـ ەر) پێکـهاتووە و دووەمیشـیان لـە (نـان)+(خـو)+(ەر). بـۆ ئیسپاتی ئـەو ڕایـەش پەنجـەی بـۆ لاپـەڕە (٢٦٥)ی ژمارە (١٠٩)ی گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ)) ڕاکێشاوە ، کـە ماموستا فازیل عومـەر ئـەو باسـەی تێدا کردووە . ڕاستی‌یەکەی (ـ ەر)ی وشـەکانی (خـوەر) و(نـان خـوەر) پاشـگر نی‌یـە و بـۆ بەڵگـەی ئەوەش لێرەدا تـەنیا هێندە دەڵێم ، کە ڕەگی ئـەو کردارە لە زمـانی ئـێرانیی کـۆن و ئاوێسـتادا (خڤـەر)ە و گـۆڕینەوەی (ڤ) بـە (و) یاسایێکی ئاشکرای زمانە ئێرانی‌یەکانە . کرداری (خواردن)یش لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لـە قـاڵبی (خـوەرن)دا دەردەکـەوێ و (خوەر)یش بنەماکەیەتی . بەوێنە لەو دیالێکتەدا دەوترێ : ((خوەرن گەند و گویە ، شوشتن ڕەنگ و بوویە)) .

کــورد و تــەنــانــەت زمــانــەوانان(٤)و کــەڵەشاعیرانیش (ـ ەر)یان بە هەڵە ئیزافەکردووە و (هەڵرێژەر) و (سەرنج ڕاکێشــــەر) و (سەرســـــوڕمێنەر) و (وشـــــەداڕێژەر) و (بزوێنەر)...یان،لە بریتی (هەڵڕێژ) و (سەرنج ڕاکێش) و (سەرسوڕهێن) و (وشەداڕێژ) و (بزوێن).. بەکارهێناوە و بــەکاردەهێنن... جــا بــەپێی ئــەو ســـاز و ئـــاوازە نـــادروســـــتە بـــێ ، دەبــێ ئــەو وشــە جـــــوان و ڕەســەنــانــەی ســــــەرەوە بـــــــــکرێـــن بــە (خــۆش نووسەر) و (سەرتاشەر) و(ئاوکێشەر)و(کەللەتەزێنەر) و (خـــەم ڕەوێنـــەر)... و بەمـــە بخرێنـــە نێـــو دەریـــای سەرگەردانی‌یەوە و وایان لێ بێ بۆ کەس قووت نەچن .

ئەگەر هەڵەی (هەڵڕێژەر) و (سەرنج ڕاکێشەر) تـەنیا لـە زیـــادکردنی پاشگــری (ـ ەر)ەوە بێ ، ئــــەوە هــەڵــەی

---

٤) یەکێك لەو زمانەوانانە خۆمم ، کە تا چەند ساڵێکیش لەمەوبەر لە گەڵ نووسیندا ئەو هەڵـەیەم کردووە. هەڵەیێکی دی ئەو تەرزە ، ئەوەیە لە لاپەڕە (٣١)ی کتێبی ((وشەڕۆنان لـە زمـانی کوردیـدا))دا زاراوەی (وشـەداڕێژەر)م بــەکارهێناوە ، کــە ڕاســتەکەی (وشــەداڕێژ)ە . بــاش بــوو هەســتم بــەو نادروستی‌یە کرد و ئەو چەوت و چەوێلی‌یەشم وەلاوە نا ... ئامەوێ لێرەدا هیما بۆ دەیان نووسینی ئەم چەند ساڵەی دوایی نووسەرانی ناسراو بکەم ، کە لەو جۆرە هەڵانە قوتـار نـەبوون و تـەنیا هیـوام وایـە ، ئـەوانیش ئـەو ڕاستی‌یە لەبەرچاو بگرن .

(سەرسـوڕمێنەر) ، وێـڕای زیـادیی پاشـگری (ــ ەر) ، هەڵەیەکی دیشی تێدایە ، ئەویش لە دانانی (مێن)دایە ، کـە ڕەگی کـرداری (مـان)ە . وەك پێشتر بـاسمان کرد ، پاشگری (ـ ەر) دەچێتە سەر کرداری تێپەڕ ، بەڵام (مان) تێنەپەڕە . جا ڕاست وایە ، کرداری (هێنان) ، کە تێپەڕە بکرێتـە کەرەسـتەی ئـەو ڕۆنانـە و ئـەو ئەرکـە (هێـن)ی ڕەگی بیبینێ و بوترێ : (سەرسوڕهێن) .

وەك پەنجـــەمان بـــۆ ڕاکێشـــا ، وشـــەی (دانـەر...تێکۆشـەر...) ، ئەگـــەر ڕۆنانیـان دروسـتیش نـــەبێ ، دەرهـــاویشتنیان لـــە زمـانی کـــوردی کـارێکی ناهـەموارە ... بـە پێچەوانەشـەوە وشـەی وەك (سەرنج ڕاکێشەر ، سەرسوڕمێنەر...) لەبەر ئەوەی تەواو نامۆن ، لەگەڵ ئەو هەموو بەکارهێنانە زۆرەشدا هەر بێ شوێن و بێ لانەن و بە زۆرە ملێش جێیان نابێتەوە .

پێویسـتە ئـەوە لـەبیر نەکـەین ، پێنـج کـردازی (کـردن ، بـردن ، خستن ، دان ، نـان) ، کـە (کــە ، بــە ، خــە ، دە ، نێ) دەبنە ڕەگیـان ، ئـەگەر وشەی واتـادار لە پێشیانەوە بـێ ، دەشـێ پاشـگری (ــ ەر) وەربگـرن . وەك :

تـەماشا + کە + ەر – تەماشاکەر

ڕاو + كه + هر = ڕاوكهر (٥)

......

ڕێ + به + هر = ڕێبهر

پهیام + به + هر = پهیامبهر

......

پێش + خه + هر = پێش خهر

سهر + خه + هر = سهرخهر

......

ههواڵ + ده + هر = ههواڵدهر

ڕهنج + ده + هر = ڕهنجدهر

......

چێشت + لێ + نه + هر = چێشت لێ نهر

پاڵ + نێ + هر = پاڵ نهر

......

---

٥) ئهگهرچی تێكڕای نووسهرانی ڕێزمانی كوردی و نووسهری ئهم وتارهش (كهر)یان به پاشگر له قهڵهم داوه ، بهڵام دكتۆر ڕهفیق محهمهد شوانی ڕاست بۆ ئهوه چووه ، كه دهڵێ (كهر له (كه)ی ڕهگی چاوگی (كردن) و پاشگری (ـهر) پێكهاتووه (بڕوانه : نامهی ماجستێر ، ل ٧٤) . بێگومان تیشكی ڕووناكیی ئهو بۆچوونهی مامۆستا ڕهفیق ، ئهوهشمان نیشان دهدا ، كه (بهر) و (دهر) و (خهر) و (نهر)یش له ڕهگی (بردن)و (دان) و (خستن) و (نان) و پاشگری (ـهر)هوه پهیدابوون.

چوار ڕەگی (کە ، بە ، خە ، دە) ، کە کۆتاییان بە بزوێنی (ە) هاتووە ، کاتێ پاشگری (ـ ەر) وەردەگرن ، وەك یاساییێکی گشتیی فۆنەتیکی کوردی لەو دوو (ە)یە ــ واتە (ە)ی کۆتایی ڕەگەکان و (ە)ی سەرەتای پاشگرەکە ـ یەکێکیان تێدەچێ . هەرچی (نێ)شە ، کە پاشگری (ـ ەر)ی پێوە دەلکێ (ێ)ی کۆتایی ڕەگەکە نامێنێ و (ە)ی سەرەتای پاشگرەکە دەمێنێتەوە .

پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشین ، کە جگە لە ڕەگی (نان) ، ڕەگی تێکڕای چوار کردارەکەی دی . واتە (کردن ، بردن ، خستن، دان) . دەتوانرێ بە یاریدەی پێشگری (ب ـ) و پاشگری (ـ ەر) بکرێن بە ناوی کارا .

بەوێنە :




* * *

# (ڕاناو) و (ڕاناواندن) و (پۆلێن کردن)

وشەی (ڕاناو) باش مەبەست ناپێکی و خوێنەر لە ماناکەی ڕادەمێنێ . چونکە :

بەشی یەکەمی ئەو زاراوەیە ـ بە گەلێ واتا دێ.

بەنموونە :

١ـ تەکبیر (بیروڕا) لە (رأی) عەرەبی‌یەوە .

٢ـ ڕێ ، ڕێگە :

ڕابەر > ڕێبەر

(ڕا)ش پتر ڕێژە فارسی‌یەکەیەتی و (ڕێ) کوردییە.

٣ـ وەك پێشگرێك دەچێنە سەر کردار :

هاتن ـ ڕاهاتن

کردن ـ ڕاکردن

گرتن ـ ڕاگرتن

ماڵین ـ ڕاماڵین

دان ـ ڕادان

هێنان ـ ڕاهێنان

بوون ـ ڕابوون

... هتد .

٤ـ ئەڕا - بۆچی

٥ـ وەك پاشبەندی (وە/ەوە) :

لە تۆوە - لە تۆڕا

لە منەوە = لە منرا

لە هەولێرەوە = لە هەولێررا

٦- جار ، کەرەت :

ئەمڕا = ئەمجارە

٧- شیان (ڕات ناکەوێ)

و هەندێ واتای دی .

(ڕا) : کە ئەو هەموو مانایەی هەبێ ، هەڵبەت بۆ خوێنەر ئاسان نییە یەکسەر تێ بگا ، کە لە پێش وشەی (ناو)دا دابنرێ ، بزانێ کام مانایان مەبەستە .

لەگەڵ ئەوەدا ، کە (ڕا) ئەو هەموو مانایەی هەیە ، ئەوجاش واتای (جێ) ناگەیەنێ و مەبەستیش لەو زاراوەیە ، ئەوەیە (جێیناو) بگرێتەوە.

شێوە ڕۆنانی ئەو زاراوەیە لە هەندێ زماندا بەم جۆرەیە :

یۆنانی : antonymia =(anto جێ) و (nymia - ناو)

لاتینی : pronomen = (pro - جێ) و (nomen - ناو)

ئینگلیزی : pronoun = (pro - جێ) و (noun - ناو)

ڕووسی: mes/toemenye = (mesto - جێ) و (emya - ناو)

... هتد.

کەواتە (جێناو) لە گشت ڕوویەکەوە ، واتە بەپێی ڕوخسار و ناوەڕۆك لە (ڕاناو) ڕوونتر و ڕاستتر و تەواوتر و گونجاوتر و بەرفراوانترە ... :

١. (جێ) بەتەواوی لەگەڵ (anto)ی یۆنانی و (pro)ی لاتینی و ئینگلیزی و(mesto)ی ڕووسیدا یەك دەگرنەوە .

٢. لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە کاری دێنن و بە پێی ئاوازی دەنگیی خۆیان ، کردوویانە بە (جیناڤ) . وێڕای ئەوە خەڵکی ئەو ناوچەیە لەم وشە لێکدراوە بە ئاسانی دەگەن و لە (ڕاناو) تێناگەن .

٣. (جێ) تەنیا یەك واتای هەیە ، کە ئەویش (شوێن)ە و واتاکەشی زۆر ئاسان و ڕوونە . واتە هەرچی (ڕا)یە مۆرفێمێکی فرەواتایە و زوربەی ماناکانیشی لێڵ و گرانن... وەك ئاشکرایە ، بۆ زاراوە وشەی یەك واتایی لە فرەواتایی پەسەندترە .

ئەو زاراوە نوێیانەی ئەمڕۆ لە زمانی بێگانەوە وەردەگیرێن ، پێویستە لە بە کوردی کردنیاندا لە ڕێ و ڕێبازی زمانەکەمان لانەدرێ . بە وشەی نابەجێ و ناقۆڵا یاسا و دەستوورەکانی نەشێوێنرێ ... ڕەنگە نابەڵەد و نەشارەزا بە نیازی ڕاژەی زمانەکەی ئەمەی لێ ڕوویدا و ئاکامی خزمەتەکەی ببێتە زەرەر و زیان ... بەڵام سەیر و سەمەرە ئەوەیە ، هەندێ زمانەوانانی کورد زاراوەی

ئـەوتۆ دادەڕێـژن ، کـە یـەکجارەکی ئـاواز و ئـاوەزی کوردایـەتی دەشـێوێنن . بەنموونـە چـەند مـانگێك لەمەوبـەر برایـەکی زمانـەوان بـۆ (pronominalzation) ـــ (بەجێناوکـردن) ، زاراوەی (ڕانـاواندن)ی دارِشـتووە... وێڕای ئەوەی ژمارەییەك زمانـەوانانی کـورد گـەلێ ڕووی پاشگری (ـ اندن)یان ساخکردووەتەوە ، ئەمڕۆ تەنانـەت کۆلکـەخوێندەواری کوردیـش دەزانـێ ، وشـەکانی وەك (ژن ، پیاو، دەرگا ، پەنجـەرە ، ئاسمان ، شـەقام... نـاو ، ڕاناو ...) بە تۆپزیش ئەو پاشگرە وەرناگرن ... ئێدی ئەو زمانەوانـە گاڵتـە بـە زمـانی زگمـاکی دەکـا ، یـان کـورد وتەنی ((لە بێ خەبەران کەشکەك سڵاوات)).

زاراوەی (ڕاناو) خۆی بارە بەسەر زمانی کوردییەوە ، کـەچی کـاکی زمانـەوان پاشـگری (ــ انـدن ) یشـی خستووەتە سـەر... ئەمـە ئەو پەندە دێنێتـەوە یـاد ، کـە دەڵـێ ، (( ڕێـوی خـۆی نـەدەچوو بـە کونـەوە ، هەژگێکیشی بەستبوو بە گونەوە)) .

هەرچی زاراوەی (پۆلێن) و (پۆلێن کردن)ە و بەرانبەر (التصنیف) بەکاری دەهێنن ، دەتوانم بڵێم یەکێکـە لـە زاراوە [illegible]ـراب دروست کراوەکان... بەر لە هەر شت ، ئەوە دەزانین ، پاشگری (ـ ێن)، کە دەچێتە سەر ناو بە زۆری نـاوی یـاری پـەیدا دەبـێ ، وەك : (هـەڵماتێن ، تۆپێـن ،

هەلووکێن ، میزراحێن ، کلاوکلاوێن ، مووشێن ...). هەڵە نی‌یە بۆ ناوی یاری‌یێك ، کە شتێکی‌تێدا بکرێ بە چەند پۆلێك ، زاراوەی (پۆلێن)ی بۆ دابنرێ. واتە بۆ پێکهاتنی ناوی ئەو یاری‌یە ، پاشگری (ـ ێن) بخرێتە سەر وشەی (پۆل)... بەڵام سەیر ئەوەیە هەندێ زمانەوان زاراوەی (کارپۆلێن کردن) بەکاردێنن ، وەك بڵێی یاری کردار دابەش کردن بکەن .

لە زمانی کوردیدا بۆ مەبەستی (التصنیف) وشەمان زۆرە ، وەك (دابەش کردن ، دابڕین ، دەستەبەندی ، بابەت بەندی ...) . بەڵام ئەگەر ئەو زمانەوانانە ئەمانەیان پێ باش نەبێ و دڵیان بە (پۆل)دا چووبێ ، ڕاستتر وابوو ئەو حاڵەتەیان وەربگرتایە ، کە بەبێ پاشگری (ـ ێن) بەکارهێنراوە ـ (پۆل کردن) . ئەم حاڵەتە لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا دەگونجێ و لەگەڵ وشەی بێ‌گومانی وەك (بەش کردن ، کەرت کردن ، لەت کردن...)دا یەك دەگرێتەوە .

ئەوەی پتر جێی سەرنج بێ ، جارجار ( پۆلێن) بە بێ کرداری (کردن) دەبینرێ ، وەك : (ئەم جۆرە پۆلێنە بووەتە هۆی ...) ؛ (پۆلێنەکەی مامۆستا فلان) ؛ (پۆلێنێکی تەواوە ...) ...ئەمەش هێندەی دی بەکارهێنانی زاراوەکەی نابەجێ و ڕەزاقورس کردووە.

* * *

## (سەرپەرشتیار )و ...

مایە و ئامیانی خۆشی و شانازییە ، کە لەم ساڵانەی دواییەدا چەندین نامەی ماجستێر و دکتۆرای لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراون و گەلێ زانیاریی نوێ و لایەنی باس نەکراویان گرتووەتە خۆ و ، تێکڕا ڕاژە و خزمەتێکی چاکیان لە پێشخستن و گەشەپێدانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زمانناسیدا کردووە... بەندە داخوازە و بە هومێدە ، گەر چەند سەرنج و تێبینییەك دەربارەی هەندێ زاراوە و وشە و کوردی نووسینی بەشێك لەو نامانە بخاتە بەرچاو ، بە دڵی فراوان وەربگیرێ و لۆمە و گلەیی لێنەکرێ .

لەسەر بەرگی زوربەی زۆری ئەو نامانە بەرانبەر (المشرف)ی عەرەبی زاراوەی (سەرپەرشتیار) دانراوە .

چۆن پێشتر ڕوونم کردەوە ، کە ناشێ پاشگری (ـ ەر) بخرێتە سەر وشەی لێکدراو و هەڵەیە بوترێ : (سەرنج ڕاکێشەر) و ڕاستەکەی (سەرنج ڕاکێش) ە ، بە هەمان چەشن دەڵێم پاشگری (ـ یار)یش بە چەشنی (ـ ەر) ڕاست نییە بخرێتە سەر وشەی لێکدراو و بوترێ (سەرپەرشتیار) ، چونکە (سەرپەرشت) بە تەنیا و بەبێ پاشگری (ـ یار) مەبەستەکە دەگەیەنێ... ئەو جۆرە وشە لێکدراوانە : (سەرنج ڕاکێش) و (سەرپەرشت)...

خۆیان بوونەتە ناوی کارا و ئیتر پێویستیان بە پاشگری (ـ ەر) و (ـ یار) نامێنێ .

بۆ زێدە ڕوونکردنەوە ، ئەوە دەخەینە پێش چاو ، کە کورد

دەڵێ (چاودێر) و ناڵێ (چاودێریار)

دەڵێ (سەرکار) و ناڵێ (سەرکاریار)

دەڵێ (دەمڕاست) و ناڵێ (دەمڕاستیار)

دەڵێ (سەربەست) و ناڵێ (سەربەستیار)

دەڵێ (کارگێڕ) و ناڵێ (کارگێڕیار)

دەڵێ (سەرپاڵە) و ناڵێ (سەرپاڵەیار)

دەڵێ (سەرکەوت) و ناڵێ (سەرکەوتیار)

دەڵێ (سەربڕ) و ناڵێ (سەربڕیار) ((لێم بۆتە میری سەربڕ))... (کەسێ کە سەر دەبڕێ) .

... هتد .

خەوشی سەرناوی هەندێ نامەش ئەوەندە زەقن ، خوێنەر وڕ و ئەبڵەق دەکەن ... تێناگەم مامۆستای سەرپەرشت و خوێندکار لەو ماوە درێژەی بە ئەنجام گەیاندنی کارەکەیاندا ، چۆن دەرکیان پێنەکردووە و ڕاستیان نەکردووەتەوە. بۆ نموونە ساڵێك لەمەوبەر نامەیێکی دکتۆریم بەم سەرناوەی خوارەوە بینی :

((هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە کوردیدا))

ڕاستە ، وشەکانی ئەو ڕستەیە کوردین ، بەڵام دارشتنەکەی عەرەبی‌یە و ، ڕوون و ئاشکرا دیارە، کە وشە بە وشە لە (بعض الجوانب فی العلاقة بين الجملة ودلالتها فی الكردية)وە کراوەتە کوردی.

بە کوردی دەوترێ :

((هەندێ لایەنی پێوەندیی نێوان ڕستە و واتا لە زمانی کوردیدا))

بەو پی‌یە پێویستە :

١- (لە)ی نێوان وشەی (لایەن)و (پەیوەندی) لابدرێ و (ی)بخرێتە سەر (لایەن) - واتە نەك (لایەن لە پەیوەندی)، بەڵکو (لایەنی پێوەندی).

٢- بنووسرێ (پێوەندی) ، چونکە ئەمیان ڕێژەی تەواوی کوردی‌یە ، نەك (پەیوەندی)...

٣- لە کۆتایی وشەی (پێوەندیی) دوو(ی) بنووسرێ ، لەبەر ئەوەی وشەکە خۆی بە (ی) کۆتایی هاتووە و (ی)یەکیش بە وشەی (لایەن)یەوە دەبەستێ - واتە نەك (پەیوەندی نێوان) ، بەڵکو (پێوەندیی نێوان).

٤ـ بوترێ (لە زمانی کوردیدا) ، نەك (لە کوردیدا)، چونکە لە عەرەبی‌یەکەشدا وتراوە (في اللغة الكردية) ، نەك (في الكردية).

٥ـ بێتو دارشتنەکە بەو چەشنەی نووسەری نامەکەش بهێڵرێتەوە ، ئەوە دەبوو وشەی (پێوەندی) لە حاڵەتی کۆدا بێت ... ئەوەتە کورد

دەڵێ : (هەندێ وتە لە وتەکانی مامۆستا) و

ناڵێ : (هەندێ وتە لە وتەی مامۆستا)

یەژێ : (هەندێ ماف لە مافەکانی ژنان) و

نایەژێ : (هەندێ ماف لە مافی ژنان)

...هتد .

بەڵام نووسەر لەبەر ئەوەی (العلاقة)ی عەرەبی تاکە ، کە کردوویە بە کوردی هەر بە تاکی هێشتوویەتەوە.

وێرای ئەمانە ، سەرنج بۆ سێ ناتەواویی دی ئەو سەرناوە رادەکێشم :

١ ــ لە بەندی سێیەمی لاپەرە (١)دا ، کە باسی (سنووری لێکۆڵینەوەکە)ی دەکا ، وتوویە ، کە تەنیا لە چوارچێوەی (رستەی سادە)دا لەو باسە دەکۆڵێتەوە ... جا بۆ ئەوەی بە سەرناوی نامەکەدا لە ناوەرۆکی بگەیشتینایە ؛ یاخود بۆ یەکگرتنەوە و هاودەنگیی

ناو و ناوەڕۆك ، ڕاست وابوو وشەی (سادە)ی بە دوا (ڕستە)دا تۆمار بکردایە ـ واتە بینووسیایە :

(هەندیٚ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستەی سادە و واتا لە کوردیدا)

٢ـ لەهەمان بەندی سێیەمی لاپەڕە (١)دا لە نێوان دوو تەقەڵدا نووسیویە : لە چوارچێوەی ـ زاری کرمانجیی ناوەڕاست ـ دایە. بەم پیٚیە ، باش وابوو بەم چەشنەی خوارەوە بیٚ :

أـ هەندیٚ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە زاری کرمانجیی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا.

یاخود ب ـ هەندیٚ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە زمانی کوردیدا (بە کەرەستەی زاری کرمانجیی ناوەڕاست).

٣ـ سەرنج ڕاکیٚش بە تایبەت ئەوەیە ، لە سەرناوەکەدا وتراوە : (هەندیٚ لایەن). وا پیٚدەچیٚ ئەمە یان فیٚلٚ و تەڵەکەبازی بیٚ لە هەڵبژاردن و دانانی سەرناوی کاری زانستیدا ، یان کۆڵەواری و نابەڵەدی .

بۆ حاڵەتی یەکەم ، گەر خوێندکارەکە دەرك بە بەشێك لە پێوەندییەکانی نێوان ڕستە و واتا نەکا ، ئەوە کاتیٚ پرسیاری لیٚبکریٚ ، بۆ فلاٚنە پێوەندیت یادداشت نەکردووە ، لە وەڵامدا دەشیٚ بڵیٚ ، من نەم وتووە

(هەموو پێوەندییەکان) و وتوومە : (هەندێ لایەنی پێوەندی)...

بۆ حاڵەتی دووەم ، توێژەر دەبێ ئەوە بزانێ ، یان پێویستە لە گشت (لایەنەکانی پێوەندی) بدوێ ، یان دەست نیشانی ئەو (لایەنانەی پێوەندی) بکا، کە لێیان دەکۆڵێتەوە.

بێگومان سەرناوی ئەو نامەیە ، بەو چەشنەی دانراوە ، نەك هەر بە هیچ چەشنێك ناشێ بکرێتە سەرناوی نامەیەکی دوکتۆری ، تەنانەت بۆ وتارێکی زانستییش نابێ... بە کورتی ئەمە سەرناوی وتاری ڕۆژنامە ، یان گۆڤارێکی گشتیی کۆمەڵایەتییە .

بەڵێ لەمەدا ، مامۆستای سەرپەرشت دەبێ لێم ببورێ ، گەر بڵێم ، ئەمە گوناهی ئەوە ، چونکە :

١ـ لە ماوەی دوو ساڵی نووسینی نامەیەکدا ، گەر بە باشی لەگەڵ خوێندکارەکەدا کاری بکردایە ، ئەوە ، ئەو هەڵانەی بۆ ڕاست دەکردەوە.

٢ـ خوێندکار تازە پێی ناوەتە سەر ڕاستە شەقامی زانست ... هەرچی سەرپەرشتە دەبێ بەشێکی زۆری ئەو ڕێگەیەی بڕیبێ.

* * *

بەشێك لەو دەزگا و رێكخراوانەی لەم چەند ساڵەی دواییدا دامەزرێنراون ، (پێڕۆ) و (بەرنامە)ی خۆیان بە سەرناوی - (پەیڕەوپڕۆگرام)ەوە داڕشتووە.

(پەیڕەوپڕۆگرام) زاراوەییێكی یەكجار نادروست و پڕ خەوشە :

١- (پەیڕەو) زاراوەییێكی فارسی‌یە وكوردییە ڕەسەنەكە (پێڕۆ)یە و ، تەنانەت لە (پێڕەو)یش ڕاستترە .

٢- (پڕۆگرام) ، كە وشەییێكی یۆنانی بێ و واتای (ئیعلان ؛ بۆ ئاگاداری) بگەیەنێ ، ئێدی چۆن دەشێ لە (بەرنامە)كەی خۆمان چێتر بێ(٦) .

٣- لە ڕووی ڕۆنانیشەوە ئەو هەڵەیە كراوە ، كە دوو وشەی (پەیڕەو) و (پڕۆگرام) ، بێ یاریدەی (و) دراونەتە دەم یەك . (پەیڕەو) خۆی وشەییێكی ناسادەیە و لە (پەی+پێ) + (ڕەو - ڕۆ:ڕۆیشتن) پێكهاتووە ، بە چەشنی پێكهاتنی (ماست+ئاو)=(ماستاو)... واتە ئێمە دەتوانین بڵێین (ماستاو ... پێڕۆ ...)... بەڵام چۆن ناتوانین وشەی (تەڕەپیان) لەگەڵ (ماستاو) بكەینە یەك

---

٦) عەرەب لە ڕێگەی زمانی فارسییەوە وشەی (بەرنامە)ی وەرگرتووە و كردوویە بە (برنامج) ... (سیوطی)یش لەو بارەیەوە وتوویە : ئەو وشانەی بە (مج ، ذج ، زج) كۆتاییان دێ ؛ وەك (برنامج ، ساذج ، طازج ...) عەرەب لە فارسییەوە وەری گرتوون . واتە ئەسڵەكانیان (بەرنامە ، سادە ، تازە ...)ن .

وشە و بڵێین (ماستاوتەڕەپیان)... بەهەمان چەشن (پەیڕەوپڕۆگرام)یش پێك نایەت .

کەواتە :

(ماسناو و تەڕەپیان)، نەك (ماستاوتەڕەپیان)

(پەیڕەو و پڕۆگزام) ، نەك (پەیڕەوپڕۆگرام)

ڕاست تریش :

**(پێڕۆ و بەرنامە)**

* *

*

## توانا

لە زمانی کوردیدا پاشگری (ـ ا) ، کە دەچێتە سەر ڕەگی کرداری تێپەڕ ناوی کارا پێك دێنێ . وەك

| چاوگ | ڕەگ | پاشگر | ناوی کارا |
|---|---|---|---|
| توانین | توان | | توانا |
| زانین | زان | ـ ا | زانا |
| بینین | بین | | بینا |

وێنەی پاشگری (ـ ا)ی کوردی لە زمانی پەهلەویدا لە شێوەی ( ـ اك)دا دەبینرێ . بەوێنە : ((داناك)) ، کە لە (دانا)ی ڕەگی کرداری ((دانستن)) و پاشگری (ـ اك) سازبووە ؛ یاخود وشەی ((ڕەڤاك)) ، کە لە ((ڕەڤ))ی کرداری ((ڕەفتەن)) و پاشگری (ـ اك) پێکهاتووە. لە

زمانی فارسیی نوێدا بە هەمان شێوەی کوردی دەبینرێ.
بەنموونە ((دلنا)) (دانا) ؛ ((شنوا)) (گوێگر) ؛ ((کوشا)) (تێکۆشەر)...

لەم کورتە لێدوانەدا مەبەستمان ئەوەیە ، بڵێین ، نەمانبینیوە کەس وشەی (زانا) - (عالم) بە هەڵە بەکاربهێنێ ... کەچی بەپێچەوانەوە ، زۆربەی نووسەران و تەنانەت زمانەوانەکانیش وشەی (توانا) - (قادر) بە (قدرة) تێگەیشتوون...(۷)

ئەوەتە ، کە دەڵێن : (لە توانای مندا نییە) ؛ (بەپێی توانا)... دیارە هەست بەوە ناکەن ، کە لێرەدا (توانا) یانی (بەهێز ، بەوزە، بەتاقەت، بەتابشت ...) ، نەك وەك ئەوان ، کە بە (هێز ، وزە ، تاقەت ، تابشت ...) وەریان گرتووە .

کەواتە ، ڕاستەکەی ئەوەیە بوترێ (لە توانستی مندا نییە ؛ لە توانی مندا نییە ؛ لە توانینی مندا نییە ...) ؛ (بەپێی توانست ؛ بەپێی توان ؛ بەپێی توانین ...) .

---

۷) شاعیرانی پێشوو ، گۆڕان تووشی ئەو هەڵەیە نەبووە و ، ئەوەتە ڕاست وتوویە :

توانست و هێز هەرچی گشتی هیی گەلە
وەك ئیشتیاقی قیعل لە یەك بنجی مەصدەرە !
(ل ٤٧٩)

هەر لە سایەی یەکیەتیدا بێگومان توانست ئەبێ
خەم ئەهێڵن و بڵێن وا دەردی خۆمان چارەکرد
(ل ٤٨٢)

بەڵگەی ڕوونکردنەوەی تەواویش ، ئەوەیە ، وشەکانی (بەهێز ، بەوزە ، بەتاقەت ، بەتابشت ...)ی هاوواتای (توانا) بە هەمان شێوە لەو جۆرە بەکاهێنانەدا جێیان نابێتەوە و کورد هەرگیزاوهەرگیز نەیوتووە و ناڵێ :

(لە بەهێزی مندا نییە) ؛ (بەپێی بەهێز)

(لە بەوزەی مندا نییە) ؛ (بەپێی بەوزە)

(لە بەتاقەتی مندا نییە) ؛ (بەپێی بەتاقەت)

(لە بەتابشتی مندا نییە) ، (بەپێی بەتابشت)

جا بەو پێیە (لە توانای مندا نییە) و (بەپێی توانا)ش هەڵەیێکی گەورەیە و هەروەك ئەوەش وایە بوترێ (لە زانای مندا نییە) و (بەپێی زانا)... کە ئەمیش ڕاستەکەی (لە زانستی مندا نییە) و (بەپێی زانست)ە .

تێناگەم !...بۆ دەبێ ڕۆژانە بە هەڵە (توانا) لە جێی (توانست ، توان ، توانین ...) بوترێ و کەچی هاوواتاکانی (توانست...) ڕاست ببێژرێ :

(لە هێزی مندا نییە) ؛ (بەپێی هێز)

(لە وزەی مندا نییە) ؛ (بەپێی وزە)

(لە تاقەتی مندا نییە) ؛ (بەپێی تاقەت)

(لە تابشتی مندا نییە) ؛ (بەپێی تابشت)

* * *

## بەرانبەر

بۆ ڕۆنانی وشەی لێکدراوی کوردی چەند ناوبەند (ئینتەرفیکس)ێك دەوری دیار و گرنگ دەبینن .

بەوێنە :

١- (ان) :

بەرانبەر ، سەرانسەر

٢- (او) :

کوناودەر : ڕەنگاوڕەنگ

٣- (بە) :

چاوبەکل ، گوڵبەدەم

٤- (ەو) :

بانەوبان : شارەوشار

٥- (ە) :

بەردەنوێژ ، گوڵەباخ

٦- (و) :

لەرزوتا ، هێلکەوڕۆن

ئەوەتە یەکەم ناوبەند (ان)ە و ئەوانی دیش (او) ، (بە) ، (ەو) ، (ە) ، (و) . بەو پێیە ، کە بڵێین ، لە کوردیدا ناوبەندێك بە نێوی (ام)ەوە نەبێ ، ئەی دەربارەی (ام)ی وشەی (بەرامبەر) دەبێ وەڵاممان چ بێ ؟

(بەرامبەر) ئەسڵەکەی (بەرانبەر)ە و کوردی سلێمانی وا شێواندوویەتی ... ئەوەتە ، نەك هەر لە دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی دیی زمانی کوردیدا (بەرامبەر) نابینین ، بەڵکو زووش لە ناوچەی سلێمانی هەر (بەرانبەر ) بەکارهێنراوە و دیوانی نالی و سالم و کوردی و مەحوی ... یش شاهیدی ئەو ڕاستییەن .

گەلۆ !... کەواتە ڕاست وایە نە لە زوربەی کورد دووربکەوینەوە و نە ناوبەندی (ان) بکەیەنە (ام)... جا چێتر وایە (بەرامبەر) فەرامۆش بکەین و بنووسین (بەرانبەر) .

- ماوێتی -

